# هەنگاونان لەڕێگەی ڕاستی
# بۆ گەیشتن بەڕاستگۆیی



نوسینی :
ئێناس عدنان

بۆ وتەیەکی ڕاست عەقڵ بدوێنە
هەتا ئەتوانـــی نەفس بشکێنە



# هەنگاونان لەڕێگەی ڕاستی
# بۆ گەیشتن بەڕاستگۆیی

نوسینی

ڕێناس عدنان

ئامانجی سەرەکیم تەنها سودبینینی تۆی خوێنەرە

ناوی نامیلکە : هەنگاونان لەڕێگەی ڕاستی بۆ گەیشتن بەڕاستگۆیی

نوسینی : ڕێناس عدنان

دیزاینی بەرگ: نوسەر

تایپ: نوسەر

تیراژ: ( ٥٠٠ ) دانە

شوێنی چاپ: کتێبخانەی هێڤی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی سپاردنی ( ٣١٥ )ی ساڵی ( [illegible] )ی پێدراوە

# پێشەکی

سەرەتا پێم خۆشە ئەوە بە تۆی خوێنەری ئازیز بڵێم هەر نوسینێك ئەگەر بێتە پێش چاوت یاخود هەر قسەیەك ڕێبکات بۆ لات تا بەبەر بای گوێت بکەوێت تۆ ئەبێ چ هەڵوێستێکت هەبێت ئایا لەم ڕۆژگاری تاریك و نیمچەڕوونەی کە تێیداین ئەبێ چ شتێك بکەین تا شیاوی ئەوە بێت کە لێی تێبگەین ، هەر بۆیە بە پێویستم زانی ئەم نامیلکەیە بنوسم تابتوانم کەمێك ئەوە ڕوون بکەمەوە کەبۆچی ئێمە ڕاستی مان پێخۆش نیە یان ئەگەر پێمان خۆشە بۆچی جێبەجێی ناکەین و کەسی بەرامبەر مان قبوڵ نیە کاتێك وتەیەکی ڕاست دەردەبڕێت، جا بەیارمەتی خوای گەورە چەند خاڵ و تێبینی و بەشێکی لێ باس دەکەین و هۆکارەکانی لێك تێنەگەیشتن روون دەکەینەوە لەناو کۆمەڵگا و چەرخی ئێستامان دا تا پێش ئەوەی خۆری تەمەنمان ئاوا بێت بتوانین تاڕادەیەك لەو شتانە بگەین کە پێویستە پێیان ئاشنابین،

وه بتوانين بەقسەكانمان جێگایەكی شیاو لەناو دڵدا بگرین ئەگەر بچوكیش بێت ، چونكە شیرینی ڕاستی هەموو كەسێك ناتوانێت بیچێژێت تەنیا ئەو كە سانەی كە كە موشتاق و خولیای تام كردنین.

شێوازی نوسینەكانی ناو ئەم نامیلكە بچوكە بە شێوەیەكە كەتێیدا باسی هەر شتێكمان كردبێت ئەوە بە نموونەیەك ڕوونمان كردۆتەوە یان ئایەتێكی خوای پەروەردگار یان فەرموودەیەكی پێغەمبەرمان (صلى الله عليهِ وَسَلَمْ)یاخود وتەیەكی زانا و داناو پیاوصالحێك یان پەندم بۆ هێناوەتەوەو بەپوختی لێوەی دواوین،تاخوێنەر بەشێوەیەكی باشتر لە بابەتەكە حاڵی بێت و بە شەوقتر بیخوێنێتەوە و بتوانێ نەك بە یەك شێواز بەڵكو بەشێوازیتر پەی بە بابەتەكان ببات ،هەر بابەتێك گەر نموونە یاخود بەڵگەی لەگەڵ دا نەبێت ئەوا ساردیەك لای خوێنەر دروست ئەكات كە نەتوانێت تام و چێژ لە بابەتەكە وەر بگرێت بە پێی پێویست، وە هیواشمان وایە سودێك لەدوای خۆی بۆ خوێنەر جێ بهێڵێت كە بتوانێت بەردەوامی پێ ببەخشێت لەسەر خوێندنەوە.

## چەمکی ڕاستی و بەشەکانی :-

هەر لە دێر زەمانەوە تاکو ئێستا چەندان کۆمەڵ و گەل و خەڵکی جۆراوجۆر هاتوون و تێپەڕیون ،کەسە ڕۆشن بیر و داناکانیان بەشێوازی جیاواز باسی ڕاستیان کردوە ، پوختەی ناوەڕۆکی هەموو باسوخواسەکانی دەربارەی ڕاستی ئەوەبووە، کەڕاستی هەموو شتێك دەگرێتەوە جا چ کردار یاخود گوفتار بە هەموو شێوازەکانی بەڵام لەڕووی مەعنەویەوە هەستێکی جیاوازە تەنانەت خودی ئەو کەسانەش جیاوازن لە ڕووی هەڵسوکەوتەوە لە خەڵکانی تر کە حەز دەکەن ڕاستی دەربڕن و جێبەجێی بکەن وە لەناو خەڵکیش بە چاوێکی تر سەیر دەکرێن .

جا بۆیە بۆئەوەی بەشێوەیەکی جوانتر و ڕۆشنتر تێبگەین پێویستە هەندێك لەسەر ئەوشتانە بدوێین کە ئامادەکاری دەکەن بۆ جێبەجێکردنی شتە ڕاستیەکان جا بەشێوازی جیاواز ،

کەزیاتر ئێمە باس لە مرۆ ڤەکان دەکەین لەگـەڵ سروشـتی نـەگۆڕیان کە هۆکاری چیە لەگەڵ ڕاستی دا ناگونجێن و بەیەکەوە هەڵ ناکەن.

## سوربوونی مرۆڤ لەسەر سروشتی خۆی :-

یەکێك لە دیاردە باوەکانی ڕۆژگـار ئـەوە بـووە کـە بەشـێکی هـەرە زۆری خـەڵکی سـورن لەسـەر ئـەوەی سروشـتی (تەبیعـەتی ) خۆیـان نەگۆڕن چونکە لایان وایە ئەگەر گۆڕیان توشی نائارامیـەکی دەرونـی دەبـن یـاخود توشـی زمانـە زۆر بڵێیەکـەی ئـەو کەسـانە دەبـن کـە هەمیشە حەز دەکەن لەسەر هەموو بابەتێك بدوێن و خۆیان تێ هـەڵ بقورتێنن،بەڵام خۆی لەخۆیدا ئەمەش خـۆ لادانـە لـە ڕاسـتی ،لەبـەر ئـەوەی ئەگـەر کەسـێك نـەتوانێت مـل بـە حـەق بدات واتـا دژ بـە سروشتی ناڕاستی خۆی نەوەسـتاوەو خوانـەکردە تووشـی دەمـارگیری دەروونی بووە ،وەسیفەتی مرۆڤ وایە ئەگەر شتێکی ڕاستی پـێ بڵێـی لە قازانجی ئەو دا نەبێت ئەوە هەستێك لە ناخی دا دروست دەبێـت و پێی دەڵێ ئەگەر وا بکەی زەرەر مەند ئەبی ئەگەر واش نەکات ئـەوە

توشی تەکەببورِ بووە ، هەر لەبەر ئەوە ئەو کەسە دەورێکی زۆر دەبینێت لەنەخشاندنی تابلۆی ناخی خۆی تا لەکاتی دروست بوونی ئەو هەستە بەشێوازێکی جوان وێنەی بکات تا لەگەڵ ئەو ڕاستیەدا بگات بە پلەی ئارامی دەروونی .

**تیشك خستنە سەر چەند خاڵێك کە هۆکارن بۆ نەمانی ڕاستی یا حەز پێنەکردنی :**

بێگومان ئەم بابەتە هەویرێکی ئاو خوازەو زۆری بەبەرەوەیە بەڵام لەچەند بڕگەیەکی گوشراودا ئەیخەمەڕوو:

١.هۆکارێکی هەرە سەرەکی حەز نەکردن بە ڕاستی ئەوەیە کە مرۆڤ هەندێك جار لەبیر خۆی ئەباتەوە کە خودایەك هەیە ڕەقیب و ئاگادارە بەسەریەوە تا خۆی پابەند بکات بە یاساو ڕێساکانی،چونکە هەر کەسێك بەتەواوی قەناعەتی وابێت یەکێکی هەیە کەهەمیشە ئاگادارە بەهەر وتەیەك کەلە دەمی دێتە دەرەوە دەشزانێت کە لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکات ،

ئـەوا هـەرگیز وتەیـەکی ناڕاسـت دەر نابڕێـت هـەروەکو خـودای پەروەردگار دەفەرمووێ (مَا يَلْفِظُ مِنْ قَوْلٍ إِلَّـا لَدَيْـهِ رَقِيـبٌ عَتِيدٌ)ق/١٨، واتـە: هـەر وتەیـەك لـەدەم دەردەچێت ،فریشـتەی چـاودێری لـەلای ئامادەیـە دەینوسـێت بـێ کـەم و زیـاد، لـەدوای تێگەیشتن لەو ئایەتەو جێبە جێ کردنی ئەوکات تاڕادەیـەك هەسـت بە شیرینی ڕاستی ئەکەی لەکاتی دەربڕینی دا .

٢.هەستێك هەیە کە بە یەکێك لەو هەستانە دەژمێردرێت کە ئەگـەر مرۆڤ لەسەری بەردەوام بێت بەهیلاکی دەبات ، ئەویش هەسـتی خـۆ بەگەورە زانینـە ، بـۆ ناسـینی ئـەو هەسـتە چەندنیشـانەیەکی هەیـە ئەوانیش ئەوەن خەڵکت پێ کەم بێت و خۆت پێ گەورە بێـت وە نـرخ بۆ قسەی خەڵك دا نەنێی وباسی هەڵەیەکی خۆتیان بۆ کردی دانـی پیانەنێی ، جا بۆیە خۆدور خسـتنەوە لێـی گـەورەترین گەوهـەرە بـۆ تەمـەن ،وە وات لـێ دەکـات هەمیشـە ڕاسـتی لەسـەرەوەی خـۆت دابنێی شتەکانی تریش لەخوارەوە ،

هەر لەمڕ ئەو باسە دا هەڕەشەیەکی زۆر توند هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە ئەو سیفەتەیان تیا بەدی ئەکرێت هەروەکو لە قەولێك دا هاتووە دەڵێ (مَنْ تَكَبَرَ فَقَدْ تَكَسَرَ)واتە: ئەوەی خۆبەگەورە زان بێت ئەوە خەسارەتمەند ئەبێت.

٣.زۆر گرینگی دان بە عورف و عادەت کە هەندێك جار تاکەکان دەیکەن بە بیانوو بۆ خۆدزینەوە لە ڕاستی یا بینینی یا جێ جێبەجێکردنی بۆ نمونە کاتێك دوو کەس لە بابەتێك لەیەك ناگەن وناگەن بە چارەسەرێك ،یەکێکیان لە تەمەن لەوەی تر بچوکترە ،لەو کاتەیا هەم کەسەکانی دەوروبەریان و هەم ئەو کەسەی کە بەتەمەن لەوەی تر گەورەترە ڕێز بۆ قسەکانی ئەوەی تر دانانێن و گاڵتەی پێ ئەکەن ئەڵێن چەند ڕۆژێك بەر لەئێستا لە دایك بووی چۆن دێیە مەیدانی موجادەلە و قسە لە قسەی لە خۆت گەورەتر ئەکەی ،لاتان مەعلومە کە لە عادەتی نەتەوەی ئێمە دا وایە نا بێ بچوك قسە بکات تا گەورە هەبێت ،

ئەمە لە کاتێك دا ئەو کەسەی کە تەمەنی بچوکترە ڕەنگە قسەی ڕاست و بەڵگەی ڕێك و پێکی پێ بێت بۆیە ڕێگەی لێ ئەگرن و دان بە وشە ڕاستیەکانی دانانێن .

٤.هۆکارێکی تر کە زۆر باوە لەناو کۆمەڵگای ئێستامان دا ئەویش ئەوەیەهەندێك کەس یان زۆرێك لە خەڵکان بەدوای هەڵەو کەموکورپیەکانی کەسی تردا دەگەڕێن تا بزانن ئایا ئەو کەسە چۆنە،چونکە لە ناوخەڵکی دا کاری باش ئەنجام ئەدات لایان وایە ڕەنگە لە ژێرەوە کردەی نەشیاو ئەنجام بدات، سەر ئەنجام ئەو کەسانەی کە زۆر بەدوای ئەو شتانەوەن تا بزانن ئەو کەسانە ڕاست دەکەن یاخود نا بۆیە جاری وا هەیە چەند شتێکیان بەدەست دەکەوێت ،ئیتر متمانەیان لە دەست دەدەن بەرامبەر بە کەسەکانی دەوروبەریان تەنانەت ئەو کەسانەی کە بەڕاستی ڕاستگۆشن ،بۆیە خۆشیان وایان لێ دێت کەقسەیەکی ڕاستیان بۆ باس بکرێ زۆر بەزەحمەت باوەڕی پێ نەکەن،ئەمەش لە بەر هۆکاری ئەوەی زۆر گرینگیان بەوە داوە کە خەڵك چ هەڵەیەك دەکات یاخود نا ،

هەر بۆیە لەوتەیەکی جواندا هاتووە دەڵێ(لەژیانتدا هەوڵدە وەکو یاریزان وابیت تا هەمیشە هەوڵی گۆڵ تۆمار کردن بی نەوەك وەکو ناوبژیوان بیت تەنها بەدوای هەڵەی ئەم و ئەو دا بگەڕێیت )چونکە بەوکارە هەم وات لێ دێت باوەڕ بە ڕاستی نەکەی وەهەم ناتوانی ڕاستی دەربڕی،

وە ئەم هۆکارەو گەلێکی تر کە بەڕاستی بەشێوەیەکی زۆر زەق وا لەمرۆڤەکان دەکەن ئاستی تێگەیشتنیان بۆ حەزکردن بە ڕاست بێژی و کردەی ڕاست و دروست لەژێر پلەی سفری سەدی دابێت هەر بۆیە خۆبەدورگرتن بەشێوەیەك کە جیاوازیەکەی خۆرهەڵات و خۆر ئاوابێت لەو سیفەتانە ئەوا هێشتا هەر کەمەو ماویەتی ،جابۆیە ئاگەداری بە تا هەم ڕاستی لەنەفسی خۆتو ڕاستی لەنەفسی خەڵکانی تر لێت ون نەبوە.

**ئاگەداربوون لەچەند هۆیەکی تری هەستیارکە هۆکارێکن بۆ خۆلادان لە ڕاستی:**

ئامــاژە کــردن بەچــەند خــاڵکی تــر کــە زۆر هەســتیارن و مــرۆڤ زۆر پێویستە خۆی لێ بەدوور بگرێت ،بۆیە جیام کردۆتەوە لەهۆکارەکانی تر لەبەر ئــەوەی پلــەی هەســتیاریان لــەوانی تــر زیــاترە و زۆر بــەمان سەبارەت پێی خەواڵوین ،ئەو پەڵانەش ئەمانەن :

یەکەم: چەندان جار بینراوە کاتێك کەسێك توشی بەڵاو موسـیبەتێك ئــەبێت و پاشــان ئــەو موســیبەتە بــۆی ئەبێتــە مایــەی خــەموو پەژارەیــەکی زۆر کــە تاڕادەیــەك وای لــێ دێــت پــێش چــاوی خــۆی نەبینێت ،وە ئەگەر کەسێك بیەوێت شتێکی بەبیر بهێنێتەوە لە یادی خوای پەروەردگار کە پێی بڵێت دەی قەینا خەم مــەخۆ ئــەم کێشــەیە خێری تێدایە بۆت یاخود بڵێت ئەم شتەت هەڵەیەو وازی لێ بهێنــە و تاکــەی بــەردەوام ئــەبیت لەســەری یــان پێــی بڵــێ لــەوەی تــەی ئــەم کێشەیەت بەسەر هاتووە چەندین شتی جیاوازت تێدا دروست بــووە ،

لـەو كاتـەيا پێچـەوانەی قسـەكەی ئەداتـەوەو بەشـێوازێك وەڵـامی ئەداتەوە كە بە لێك دانەوەی خـۆی لای وایـە ئـەو كەسـە قسـەيەكی هەڵەی پێوتوە چونكە ئاگەداری كردوەتـەوە ،ئەمـە لەكاتێكـدا ئـەو وتانەی كە بـۆی باسـكرد حـەقن و دوری ئەكاتـەوە لـەو ڕەفتـارە بـێ نەزاكەتەی كە تێی دایە ، لە لايەكی تر هەر كە توشـی كێشـەيەكی چاوەڕوان نەكراو ئەبێت ،خۆی بۆ نـاگیرێ و قسـەی هەڵـەو نـا ڕاسـت لەدەمی دێتەدەرەوە و ئەبێتە هۆی دڵ شكان و زيز بوونی كەسـەكانی دەوروبەری لێی ،هۆی ئەم كـارە نابەجێيـەش بەرهەمەكەی ناڕاسـتی بووە، ئەم سيفەتە وەكو ميكرۆبێكی گوشندەوايە لـەدارێكی گـەش و سەوز ئەدات كە بەماوەيەكی كەم ئەو دارە بەرەو داڕزين ئەبات،

لەهەمان تەوەرەی ئەم بابەتەدا يەكێك لە پياو صاڵيحان ئەفەرمووێ:

ئارام گرتن لەسەر كێشەكان سێ جۆرە:

١.ئارام گرتنێك سێ سەد پلەی هەيە

٢.وە ئارام گرتنێك شەش سەد پلەی هەيە

## ٣.وە ئارام گرتنێکیش نۆ سەد پلەی هەیە

ئەو ئارام گرتنەی کە سێ سەدپلەی هەیە ئارام گرتنەلەسەرگوێڕایەڵی خوای پەروەردگار،وە ئەو ئارام گرتنەی کە شەش سەد پلەی هەیە ئارام گرتنە لەسەر سەرپێچی خوای پەروەردگار ، وەئەو ئارام گرتنەی کە نۆ سەد پلەی هەیە ئارام گرتنە لەیەکەم ساتدا(کت و پڕ)واتا لەو کاتەی کە بەڵایەکەت بۆ هات ،جابۆیە لە پاش هاتنی هەر زەحمەتیەك ئەم ئایەتە لە بیر نەکەنەی کە پەروەردگارمان پێمان ئەڵێ(وَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا ۖ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ)(٤٨)الطور،واتا ئارام بگرە لەسەر حوکمی خوا تۆ لەبەر چاوی ئێمە دایت،وە بەردەوام یادو سوپاس گوزاریە بەرامبەر بە پەروەردگارت. وە لە چەندین شوێنی تردا هەروەکو خوای پەروەردگار فەرموویەتی لەدونیادا بەشت گەلێك تاقیتان ئەکەینەوە تالەنێوانتان دیار بکەوێت ئاخۆ کامتان صەبر ئەگرن و پشت بەخودای خۆتان ئەبەستن یان کامتان پشت لە ڕاستی دەکەن و خۆتان لەبیر دەکەن و

ئەوە لەبیر خۆتان ئەبەنەوە کە ئەوشتانەی بەسەر تان دێ حیکمـەت و چــاکەی تیایـــە بۆتـــان، هـــەروەکو لـــە شـــوێنێکی تـــر دائەفـەرمووێ:(وَعَسَىٰ أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْـرٌ لَكُـمْ ۖ وَعَسَىٰ أَنْ تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَكُمْ ۗ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لَـا تَعْلَمُونَ) (٢١٦)البقرة.

واتا: لەوانەیە لەشتێك حەزنەکەن و ناخۆش بێت لاتان ،بەڵام خێر و چاکەی تێدابێت وبەخێر بگەڕێت بۆتان ،وە لەوانەشە حەز لە هەندێك شت بکەن و پێشتان خۆش بێت کەچی شەڕو خراپ بێت وناکامەکەی باشنەبێ، بێگومان تەنیا خوا خۆی ئەزانێت چ شتێك چاکەچ شـتێك خراپە بۆتان.هـەر بۆیـە ئـەبێت زۆر ئاگـەداری ئـەم خاڵـەبین و لەبـەر کێشەیەکی دونیایی ڕاستی لـەبیری نـەکین ،تـا لەپلـەکانی ڕاسـگۆیی بەرە و خوارەوە نەیەین .

دووهەم خاڵ: یەکێکی تر لەخاڵە هەستیارەکان کە مرۆڤ هەتا لەتوانای دایە بەپارمەتی عەقڵ و دڵی خۆی بپارێزێت لە هەستێك کە زۆر نا موریح و ترسناکە ،هەر وەکو ئاشکرایە کە ئێمە وەکو سروشتی مرۆڤی خۆمان هیواو ئامانج و ئارەزووی زۆرمان هەیە کە پێویستمان پێیەتی تا هەمان بێت یاخود وەکو عادەتێك خومان پێی گرتووە کە لامان وایە هەمان بێت چاکترە ،بۆیە پەنا ئەبەینە بەر دوعا کردن بەهەموو شێوەکانی ، بۆ بەدی هاتنی ئەو ئارەزووەمان ئامادەین بەردەوام داوا لە پەروەردگارمان بکەین ،هەر لەبەر ئەوە جاری واهەیە ئەو دوعایانەی کە ئەیکەین نابێتە هۆی گیرابوون و بەدەست هێنانی ئارەزووەکانمان ،یەکسەر هەستێك لە ناخمان دا دروست ئەبێت کە ئەمەش بێگومان چرپەچرپ و وەسوەسەی شەیتانە ،ئەگەر زوو پێ لەو هەستە نەنێین ئەوا بەهیلاکمان ئەبات و لەبازەی ڕاست گۆیی دا فرێمان ئەداتە دەرەوە.

ئەو هەستەش پێی ئەڵێن (کەم بونەوەی یاخود نەمان و لەدەست دانی متمانە بە پەروەردگاری خۆت )کە لات وایە زۆرت داوا لێ

کردووە کەچی وەڵامی نەداویتەوە ،مرۆڤ لەهەر کاتێکی تەمەنی دابێت بەهیچ شێوەیەك نابێت متمانە بە پەروەردگاری خۆی لە دەست بدات ،لەبەر ئەوەی ئەم هەستە بەشێوەیەکی سەرەخۆرە دەرونت لاوازت ئەکات و ئیرادەیەکی بێ هێزت پێ شاد ئەکات ،وات لێ دێ نەتوانی بەپێی پێویست ڕێز لە ڕاستیەکانی دەورو بەرت بگریت چونکە سەرچاوەی هەرە گەورەی وشەو کردارە ڕاستیەکان متمانەیە بە دەرونی خۆت،دەرونی خۆشت پەیوەستە بە پلەی ئیمانت ، پلەی ئیمانیشت بەندە بەپەروەردگارتەوە کە چەندە تامەزرۆی موناجات و تێگەیشتنی لە حیکمەتەکانی کە بەدرێژایی تەمەنت یەك لەدوای یەك پێت پیشان ئەدا،هەر بۆیە گەوهەری دەرونی تاك بۆ هەرکارێکی ڕاستی بریتیە لە متمانە بەخۆ بوون و ئیرادەیەکی بەرز ،ئەگەر کەسێك ئیرادەی بۆ کردنی کارە ڕاستیەکانی نەبێت دڵنیاشە ناتوانێت متمانە بەدەست بهێنێت بەڕاستگۆیی خۆی،

وە چارەش بۆئەوەی بەهەمان شێوەی هۆیەکانی تر خۆت بپارێزی لە دوورکەوتنەوە لەهێڵی ڕاستیەکان و بۆ ئەم خاڵەت هەوڵ بدە بە

متمانەوە دوعاكانت بكەیت تا وەڵام بەدەست بهێنی نەك چارە سەر چونكە چارە سەر لەناو خودی وەڵام دایە ،وە نەكەی ئەوكاتەی یەكێك لە دوعاكانت وەڵام نەدرایەوە شەوی بێ هیوایی بەسەر دڵت دا بێنی، چونكە ئەم كارەت بەشێوەیەكی زۆر لەناكاو هەڵت ئەداتە ناو چاڵی بێ چارەییەوەهەروەكو لەم وتەیەشدا ئاماژەی پێ كراوە كە ئەڵێ(بەردەوام بوون لەسەر هەستی بێ ئومێدی بەرەو لوتكەی رەشبینیت ئەبات و لەوێوەوە هەڵت ئەداتەخوارەوە بۆ ناو چاڵی بێ چارەیی)(نوسەر).

**چەند نمونەیەك لەسەر جێ بەجێكردنی راستی كە ناخ دەرازێننەوە:**

١. راستی وا لە مرۆڤ دەكات كە بەجۆرێكی تر بڕوانێتە ژیان ،وای لێ دەكات تێڕوانینی بۆ خودی شتەكان لەلوتكەی تێگەیشتن دا بێت،هەروەكو لە حەكیمێك دەپرسن،ئایا مرۆڤ چۆن دەگات بە پەروەردگاری خۆی ئەویش لەوەڵامدا ئەڵێ بەیەك هەنگاو،پێی ئەڵێن چۆن بە یەك هەنگاو ئەویش ئەڵێ تەنها پێ لەنەفسی خۆت بنێ ئەوا

دەگەیت بە پەروەردگاری خۆت ،واتا تەنیا بە مۆمی ڕاستی دەرونت ڕوناك بكەوە ئەوكاتە ئەتوانی لەگشت ڕێگاكان تێپەڕی بە ئاسانی .

٢.حەزكردن بەتامی ڕاستی وات لێ دەكات هیچ شتێكت لەیاد نەمێنێت تا سەرقاڵت بكات جگە لەوەی پێویستە بۆخۆتی بكەی تا گرینگی پێ بدەی ،هەروەكو لەوێنەی (فضیل بن عیاض)ڕەزای خوای لێ بێت،دەفەرمووێ ئەوەندەی بەخۆمەوە خەریك بووم تا خۆم گۆڕی ئەوەندە ئاگام لە خەڵكی نەما، واتا ئەوەندەی خەریك بووە بە لابردنی ناڕاستیەكانی دەرونی و گۆڕینیان بە ڕاستی ئەوەندە خەریكی هەڵەی ئەم و ئەو نەبووە .

٣.هەندێك جار بەوتنی یا بەكردنی ڕاستی ،چەند شتێك لە دەست ئەدەی چونكە ئەو كەسەی كە ڕاستی لەسەر خۆی جێ بە جێ دەكات لەبەرامبەر ئەو كەسانەی كەوانین ئەو كات كەسەكانی تر لێی بێزار دەبن چونكە هەم لێی تێناگەن وە هەم خۆیان تامی ڕاستی ناكەن ،سەرئەنجام دەورویەری ئەو كەسە ڕاستگۆیە چۆڵ دەكەن و گرینگی بە قسەكانی نادەن ،نەوەك ئەوانیش وەكو ئەوكەسە ڕاست گۆیەیان

لیّ بیّت ،هەروەکو ئیمامی(عمر)(خوا لیّی ڕازی بیّت) ئەفـەرمووێ (وتنـی قسەی ڕاست هاوڕێیەکی بۆ نەهێشتوینەتەوە )واتا جیّ بەجیّ کردنـی ڕاستی ناخی خاوەنەکەی قەرەباڵغ دەکـات بـەڵم دەوروبەرەکـەی چـۆڵ دەکات .

٤.لەهــەمان کاتـدا ڕاسـتی دەبێتــە چـەکێکی دەم کـوت کـەر بـۆ نەزانەکان ئەگەر هاتوو ڕاسـتیت خۆشویسـت و حـەزت بـە هـەبوونی کرد، چونکە یەکێك لەهۆکارەکانی نەزانی ئەوەیە ،کە لە بابـەتێك دا بەبیّ ئەوەی بزانی ئاخۆ هەڵەی یاخود نا قسە بکەی ،وەکو لە کاتێك لەکاتەکان دا (تۆڵستۆی نوسـەری بـەناوبانگی ڕوسـی لە یـەکێك لـە شـەقامەکاندا پیاسـە ئـەکات لـەناکاو بـە تونـدی شـانی بەرشـانی ئافرەتێك ئەکەوێت ،ئافرەتەکەش بەبیّ ئەوەی بزانێت کێیـە یەکسـەر دەست دەکات بەجنیّ و دان وقسەی نەشیاو پیّـی ،ئـەویش لـەکۆتایی قسەکانی ئافرەتەکەدا کڵاوەکەی لەسەر ئەکاتەوەو ئەڵیّ خانمەکەم من لیـۆ تۆڵسـتۆی نوسـەرم ببـورە بـۆ ئـەم ڕوداوەی ڕویدا،ئافرەتەکـە بەخەجاڵەتی و سەرسوڕمان و واقی وڕماوەوە وتی زۆر داوای لێبوردن

ئەکەم نەم ناسیتەوە ،ئەویش ئەڵێ ئاخر تۆ وا چویتە ناو خۆناساندنی خۆتەوە بەشێوەیەك منت لەبیر نەما، ئەمەش واتا ڕێگەی پێنەدا تا ڕاستیەکانی بۆ ڕوون بکاتەوە یەکسەر ناخی خۆی بۆهەڵڕشت کە ناڕاستیەکان بوو.

٥.پڕکردنی ناخ لە هەموو شێوازەکانی ڕاستی وات لێ ئەکا هەمیشە گومانی ڕاست و باش بەمرۆڤەکانی دەوروبەرت بەریت ئەگەر چی یەکەم جاریشت بێ بیان بینی یاخود نەیان ناسی ،هەوەکو ڕۆژێکیان زانای گەورە (ئەبو زەید بَطـامی) بەلای ئاواییەك دا دەڕوا لە ڕێگای دا پیاوێك ئەبینێت پێی ئەڵێ شوێنێکی پاکم نیشان بە تا نوێژی لێ بکەم پیاوەکەش پێی ئەڵێ دڵت پاك بکەوە پاشان لە هەر شوێنێك ویستت لێ بوو نوێژ بکە،واتا کە دەرون پاك بویەوە لە خڵتی نا ڕاستیەکان ئەوکات هەموو شوێنێك ئەبێتە جێگای ئارامی بۆت تا کارەکانت بەباشی بکەی .

٦.وتنــی ڕاســتی وبــەردەوام بــوون لەســەری وا لەکەســی یــاخود کەسەکانی بەرامبەر دەکـات کەتوشـی دارمـانی دەروونـی بنـو بێنـە سـەر ئـەو ڕێیـەی کـە ئـەو کەسـە ڕاسـتگۆیە لەسـەریەتی هـەروەکو لەنمونـەی پیـاو چـاك (بایەزیـدی بەسـتامی)ئەوکاتەی کـە دایکـی وەسـیەتی بـۆ کردبـوو کــە هەمیشــە ڕاســتگۆبێت وە هەرچــی ئاڵتوونـەکانی هەیـە بـۆی فرۆشـت بـوو تـاوەکو بتـوانێ خـەرجی سەفەرەکەی بکات تافێری زانست بێت،بۆیە لەو کاتەی کە بایەزیـد لەگەڵ کاروانەکەی لە ڕێگەی سەفەر دابـوو کۆمەڵـە چەتەیەك دێنـە سـەر ڕێگایـان وئـەوەی پێیانـە بـەتاڵان دەی بـەن کاتێـك چـەتەکان خەریکی سەیرکردنی گیرفانی کەسەکانی کاروانەکەن تا ئەوەی پێیانە لێیان بسەنن،دەگەن بە لای بایەزید و کەسەیری دەکەن جلەکانی شڕو کەمێك دڕاوە لەنێوان خۆیان دەڵێن ئەو پیاوە هیچی پێ نیـە چـونکە لەسیمای دیارە خاوەنی هیچ نیە بۆیە یەکێك لە چـەتەکان بەگاڵتـەوە بەبایەزید ئەڵێ هاپارەت پێیە ئەویش دەڵێ بەڵێ ئەوانیش پێدەکـەنن و ئــەڵێن چــەندە ئــەویش ئــەڵێ (٨٠)ســکەم پێیــە، ئــەوانیش

بەسەرسامیەوە دەڵێن بە ڕاست!!؟ ئاخر بۆ وا دەڵێیت ناترسیت لێت بسەنین ،پاشان بەجێی دەهێڵن و ئەچنەوە لای سەرکردەکەیان، سەرکردەکەیان پێیان ئەڵێ هەمووتان تاڵن کرد ئەوانیش دەڵێن بەڵێ کەسمان نەهێشتەوە تەنها کەسێك نەبێت ئەویش لەوانەیە گاڵتەمان پێ بکات چونکە وتی پارەم پێیە لەسیماشیا پێ ناچێ ڕاست بکات، سەرکردەکەیان دەڵێ با بۆمی بهێنن ئەوانیش بایەزید ئەهێننە بەر دەمیو ،پێی دەڵێ پارەت پێیە دەڵێ بەڵێ سەرکردەکە بە سەرسامیەوە وتی بۆ وا دەڵێی ئاخر ناترسی پارەکەت لەدەست بدەیت و دەشزانی بۆتی ناگەڕێنمەوە ،بایەزیدیش لەوەڵام دا ئەڵێ من بەڵێنم بە دایکم داوە کە ڕاستگۆبم ،بۆیە هەرواش دەبم وەکاتێك گیرفانەکانی دەگەڕێن (٨٠)سکەی تێدایە، سەرکردەکەیان واقی وڕ ئەبێ وقوڕگی ئەگیرێ و دوای چەند دەقیقەیەك دەڵێ: بە ڕاستی حەیف ئێمە ئەوەندە ساڵە ماڵی خەڵکی تاڵان دەکەین و سامان کۆدەکەینەوە لەبەر ئەوەی دەترسین لەوەی بەشمان نەکات، کەچی ئەو کەسە ماڵەکەشی چەندە کەمە بەبەراورد لەگەڵ هی ئێمە

وه ناش ترسیٚ و ڕاستگۆیه لەوتەکانی ،بۆیە سەرکردە بڕیار دەدات کەتەوبە بکات ،وه هاوەڵەچەتەکانی دەڵێن چۆن دەبیٚ ئێمە بەتەنیا جێ بهێڵی چۆن لەکاری بەد و ڕێگری سەرکردەمان بووی ئاواش دەبێت لەکاری چاکە سەرکردەو پێشەوامان بیت ،بۆیە هەموویا تەوبە دەکەن و ئەوشتانەی بە تالّان بردویانە بۆ کاروانەکەی دەگەڕێننەوە ،لەم نمونەیەدا ئەوەمان بۆ ڕوون ئەبێتەوە کە ڕاست بێژی چەندە کاریگەری هەیە لەسەر دەوروبەر و تەنانەت کاریگەریەکەش بەئاشکرا دەبینریٚ.

## کورتەیەك لەسەر سەردەم و شێوازی خۆگونجاندمان لەگەڵ

لەچەرخی ئێستامان دا ئەگەر نیازت وابێت بەهۆی بەرۆکەیەکەوە یان کارێکەوە یان شێوازێکی قسەکردنەوە ،وا لەخەڵکی بکەی گویٚ لەقسەکانت بگرن و تێتبگەن تا لە چەندین بابەتی واقیعی دا ئاگەداریان بکەیتەوەو ڕێگەیان پیشان بەی نەوەك توشی هەڵەیەك بن و پەنجەگەورەی دەستی ڕاستیان بە ددانە گەشەکانیان بگەزن،ئەوا دەبێت بەشێوازێکی وا بەو ئەرکەت هەڵسیت کە توشی نەك بڵێین

کێشە نەبی بەڵکو توشی کێشە کەمتر بیت و بەجۆرێك تێیان بگەیەنی کە لەوەو پێش لەو جۆرە شێوازەیان نەبیستوەو بەموشتاقەوە گوێت بۆ ڕادێرن، تا هەم یارمەتیان بدەی لەگێژاوی غەفڵەت دەریان بێنی وە هەم ڕوخساری ڕاستیەکانیان پیشان بەی.

جابۆیە لەم هەڵوێستە نادرەت دا زۆر گرینگە ڕەچاوی چەند شتێك بکەیت کە بە ڕاستی بەیەکێك لەو شتانە دەژمێردرێن کە ئەبنە ئەزموون بۆ خۆت و بۆ ئەو کەسانەی کە ئەتەوێت یارمەتیان بدەی بۆیە چەند شتێکی هەستیاری لێوە باس دەکەین ،یەکەم لایەن کە پێویستە ڕەچاوی بکەی ئەویش ئەوەیە کە دەبێت توانای ئەو کەسە هەڵبسەنگێنیت لەلایەنی زانیاریەوە چونکە لەکاتی باس کردنی هەرشتێك بۆی ئەگەر لەئاستی زانیاریەکانی ئەودا نەبێت ئەوا ئەستەمە متمانەوباوەڕ بەقسە ڕاستەکانت بکات و تێت بگات ،لەبەر ئەوەی ئاستی لەتۆ بەرزتر بێت قسەکانت لێ وەرناگرێت وە لەتۆش نزمتر بێت مێشکی بەرگەی ئەو ڕاستیانە ناگرێت کە ئەتەوێت پێی ئاشنا بکەی ،

هــەروەكو (علـي عـزەت بێچـوفێتش)دەڵێ (بەڕاسـتی ئامۆژگـاری و باسكردنی شـتی ڕاسـت سـەیرە! زیرەكـەكان پێویسـتیان پێـی نیـە و نەزانــەكانیش سـودی لێ نابینن)بۆیــە دەبێــت بەشــێوەیەك بێــت ناوەڕۆكی قسەكانت لـە ئاستی ئـەو دابێـت تـا سـودی هـەبێت بـۆی ،لەبـەر ئـەوەی سروشـتی مـرۆڤ وایـە حـەز بـەدرۆ ناكـات و بەرگـەی ڕاستیش ناگرێت ئەگەر ئەو ڕاستیەش پەیوەندی بەوەوە هەبێت.

دووهـەم لایـەن بـۆ ئـەوەی بەشێوەیەكی ئاسانتر بتوانین كەسـەكان تێبگەیـەنین لـەو مەبەسـتەی كەدەمانەوێت بەهۆیـەوە بیـان هێـنین بۆبینینی ڕاستیەكان،ئەویش ئەوەیە پێش ئەوەی قسە بۆ هەركەسێك یان كۆمەڵێك بكەی پێویستە سەرەتا لەگەڵی بگونجێی واتـا نابێـت یەكسـەر بچـیتە لای و ڕای خـۆتی بەسـەرا بسەپێنی تا ڕاسـتەوخۆ بەئاگابێتەوە بەڵكو بەو شێوازە زیاتر لێت دوور ئەكەوێتەوە و گوێـت بـۆ ناگرێـت ،چـونكە تـۆ یەكسـەر ڕەخنـەت لێ گـرت و هەڵـەكانیت بەڕوخساری دادا ئەو كات ئـەویش كاردانـەوەی بـۆت دەبـێ هـەوەكو لەوتەیەك دا هاتووە كە دەڵێ(ئەگەر ئەتەوێت بە ڕەخنەیـەكی قـورس

کەسەکەی بەرامبەرت بڕوخێنی ئەبێ ئامادەی ئەو بەردانەش بیت کەبەرت دەکەوێت لەکاتی وەڵام دانەوەی ئەو)(نوسەر)،

لەلایەکی تر تایبەت مەندی مرۆڤ وایە کەشتێك ببیستێت لە بارەی خۆیەوە کە نەی زانیبێت یان هەستی پێنەکردبێت ئەوا دەرەنگتر تێدەگات هەرچەندە بە نەرمیش پێی بڵێی بۆیە ئاگەدار بوون لە خەسڵەتی کەسەکان زۆر گرینگە تا لەگەڵیان بگونجێی ،

وە پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێ (المؤمِنُ يألف ويؤلف ولا خَيرَ فيمَنْ لا يألف ولا يؤلف)رواه احمد(٨٩٤٥)و صحيح الباني.واتا: بڕوادار ئەوەیە بگونجێ وخەڵکیش لەگەڵی بگونجێن،هیچ خێرێك لەو کەسە نیە کە نەگونجێ وە خەڵکیش لەگەڵی نەگونجێن.لەبەرئەوەی گونجان تاکە ڕێگەیە بەهۆیەوە ڕێگەت پێ بدرێ زیاتر بابەتە ڕاستیەکان ڕوون بکەیتەوە بۆ کەسەکان .

## ئەستێرەیەك لە ئەستێرەگەشاوەكانی ئاسمانی ڕاستگۆیی:

ئەو ئەستێرە جوان و گەشاوەیەی كە باسی لێوە دەكەین ئەستێرەی میهرەبانی و گیانی لێبووردەییە كە ئەگەر لەئاسمانی ڕاستگۆیی دا پەی مان پێی برد و لە ڕوناكی و تیشكەكەی بەهرەمەند بووین ئەو كاتە دەتوانین هەست بە عیززەتی نەفسی خۆمان بكەین.

گیانی لێ بوردەیی هەستێكە كەسانێك دەبنە خاوەنی كە بەڕاستی خولیای ئەوەن ڕاستی بكەن بە پێشڕەویان و بگەن بەپلەی ڕاستگۆیی وە هۆكارێكی زۆر ئەساسیە بۆ پەیان كردن و ڕونكردنەوەی بابەتە واقیعیەكان و تێگەیاندنی خەڵك لێی،میهرەبانی و گیانی لێبووردەیی شێوازێكی زۆر جیان بەدەر لەشێوازەكانی تر چونكە لەم شێوازەدا مرۆڤ شۆڕشێك لە دەروونی خۆی دەهێنێتە ئاراوەكە زۆر ئازار بەخشە لەناخیدا بەڵام لە ڕوخسار و كرداری دا

هیچ باس و خواسێك نیە لەبارەی کاردانەوەی بۆ کەسی بەرامبەری پاشان بەو هەڵوێستە جوانە هەنگاوێك ئەتوانێ هەڵ بگرێ

بۆ تێگەیاندنی کەسەکانی تر و ئەوانیش ئاشنا بکات بەڕاستی و بەرەو گەیشتن بە ڕێگایەك لە ڕێگایەکانی ڕاستگۆییان ببات، وە لێبووردەیی دەم و ساتی نیە وە لەهەموو کاتێك دا کاریگەری خۆی بەجێ دەهێڵێ گەر ئەو کەسە لەخۆی دا بەر جەستەی کردبێت تەنانەت لەکاتی هەبوون و نەبوون دا لە خۆشی و ناخۆشی دا ،هەروەکو خوای پەروەردگار ئەفەرموێ(الَّذِينَ يُنْفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ)(١٣٤)آل‌عمران، واتا: پارێزکارە بەهەشتیەکان ئەو کەسانەن کە لە خۆشی و ناخۆشیدا،لە هەبوون و نەبوونیدا ئەوان دارایی ئەبەخشن و ڕق و غەزەبی خۆیان لەکاتی تورەبووندا دەخۆنەوە و کاری پێناکەن و لەخەلکی دەبوورن و تۆڵە ناسەننەوە ،وە خوای گەورەش خێر خوازانی خۆش دەوێ.

بۆیە بژاردەکردنی نەقسیەکانمان و گۆرینیان بۆ لیٚ بووردەیی کـارێکی زۆر شـیاوە ،چـونکە لێبـوردەیی لەگـەڵ خـۆی میهرەبـانیش بەرهـەم دەهێنیٚ لەبەر ئەوەی لێبوردەیی بـەبیٚ میهرەبانی بـە هـیچ جۆرێـك نابێـت .باگوێچـکەمان بۆئـەم بەسـەرهاتە کورتـە شـل بکـەین کـە میهرەبانی و لێبوردەیی چ دەورێکی هەیە لە پیشـان دانـی ڕوخسـارە جوانەکەی ڕاستگۆیی،

(پیاوێك بەرخێکی بردە لای زین العابدین کە قاچی شکاندبوو لێـی پرسی: بۆ قاچی ئـەو بەرخـەت شـکاندوە ،ئـەویش وتـی: بـۆ ئـەوەی تورەت کەم ! زین العابدین لەوەڵام دا وتی منـیش ئـەو کەسـە تـورە نەکەم کە ئەمەی فێر کردووی کە ئیبلیسـە ،بۆیـە بـە میهرەبانیـەوە وتی برۆ تۆ ئازادی لـە بـەر خـاتری خـودا)،واتـا ڕق و تـورەیی خـۆی خواردەوەو لەهەڵەکەی خۆش بوو ئەمەیە بەرهەمی ڕاستگۆیی کـە وا لە مرۆڤـەکان دەکـا ببنـە خـاوەنی ئـەو ئیرادەیـە ،لـەم بەسـەر هاتـە

جوانـەدا ئـەتوانین زیـاتر بـە میهرەبـانی ئاشـنا بـین لـە ڕەوتـی لێبوردەییەوە چونکە هەردوکیان وێنەیەکی زۆر جوانی ڕاست گـۆیی دەکێشن بەیەکەوە.

جـا هەوڵـدات بـۆ بـەرپابوونی لێبـووردەیی لـە ناخـت هـەرگیس بـێ ئامـانج نـات هێلێتـەوە،وە بگـرە دڵ خۆشـیش بـەلای خـۆی دا بـۆت کەمەند کێش دەکات ،لەبەر ئەوەی هەرکەسێك گرینگی بدات بە لێ خۆش بوون بێ بەش نابێت لە دڵ خۆش بوون ،کاتێك ئـەو هەسـتەت لەخۆتـدا بـەدی کـرد ئـەو کـات دەتـوانی بـۆ کەسـی تریشـی ڕوون بکەیتـەوەو پرسیاریشـت لەبارەیـەوە لـێ دەکرێ ،وەکـە لێـت پرسـرا لێبووردەیی چیە تۆش بڵێ ئەو بۆنەیە کە گـوڵ ئەیـدات لـەکاتی ورد بوونی دا،هەر چەندە باسی پلەکانی گەیشتن بە ڕاسـت گـۆیی بکـەین ئەوە حەقی تەواومان بە بابەتەکە نەداوە چـونکە ڕێگاکـانی گەیشـتن پێـی لـە ژمـارە نایـەن میهرەبـانی و لێبـوردەییش یـەکێکن لـەم ڕێگایانە،بۆیە بەیارمـەتی عـەقڵ هـەوڵ بـە لـەو ڕێگەیـەوە هـەنگاو هەڵگری تابگەی بە یەکێك لە پلەکانی ڕاست گۆیی.

## مەودایەك بۆ ڕوونكردنەوە دەربارەی هەڵسوكەوت كردن لەگەڵ كردەوەكاندا بۆ گەیشتن بە واقیع:

ئێمە لەكاتێك داین كەبەشێكی زۆری خەڵك لە ژێر سێبەری گرفتێك دا پاڵكەوتون ئەویش بڕیار دانە لەسەر ئەو شتانەی كە ڕۆژانە ئەی بینن یاخود ئەی بیستن، بەبێ ئەوەی دڵنیابن لە ڕاستی بابەتەكە كە ئاخۆ وایە یاخود نا سەر ئەنجام توشی هەڵە ئەبن لەو هەڵوێستەیاندا،

وە هەوڵ نادەن لەژێر ئەو سێبەرە هەڵبستن و بێنە بەر خۆری واقیع تا ڕێگای عەقڵیان ڕۆشن بێتەوە و ئەو هەواڵ و زانیاریانەی كە پێیان ئەگات بەتەواوی ببینن،ئەو هەڵەیەش ئەوەیە كە حەز دەكەن عەقڵیان لە چاویان دا بێت لەكاتی بڕیار دان ،یاخود عەقڵیان لە گوێچكەیان دابێت ،چونكە وا باوە كە هەر هەواڵێك یا خەبەرێك یا ڕوداوێك دەربارەی هەر كەسێك یا شتێك ببینێت یەكسەر بێ بیركردنەوە لە ناوەڕۆكی بابەتەكە بڕیاری لەسەر ئەدا،

بەهەمان شێوە کەشتێکی بۆ باس ئەکەن تەنها گوێی لێ بووە بێ وەستان بڵاوی ئەکاتەوە و بڕیاری لەسەر ئەداو ڕای خۆی لە گەڵی دا باس ئەکات،ئەمە واتا عەقڵی لە چاوی یان لەگوێیدابەستاوە،چونکە ئەم دوو شتە نابێت بکرێنە هۆکارێکی ئەساسی بۆ بڕیاردان،ئەبێ بێ شك و گومان بە عەقڵ بڕیاری لەسەر بدرێت ،بانمونەیەك بهێنینەوە تا پتر تێبگەین کە بڕیارنەدان لەڕێگەی عەقڵ کارێکی زۆر نا شایستەیە،(لە شارێك لە شارەکانی وڵاتێکی بیانی دوو گەنج سواری شەمەندەفەرێك ئەبن تا سەفەرێك بکەن،لەو شوێنەی کە دانیشتبوون دایکێك لەگەڵ کوڕەکەی لە نزیکیان دانیشتبوون خەریکی ڕوانینی دیمەنی دەرەوەی شەمەندەفەرەکە بوون کوڕەکە بەتەمەن هەر هێندەی هەرزەکارێك دەبوو ،جار جارە شتێکی ئەبینی لە پەنجەرەکە یەکسەر ئەی وت ئەها دایکە سەیری ئەوشتە بکە ،بۆ نمونە کە گیانلەبەرێکی ئەبینی ئەیوت ئەها دایە ئاژەڵ،پاش ماوەیەك لەو حاڵەتە دوو گەنجەکە لەنێوان خۆیاندا زۆر گاڵتەیان بەو کوڕە ئەهات چونکە تەنها سەیریان ئەکرد نەیان ئەزانی چ باسە، بۆیە بەگاڵتەوە بە دایکی

کوڕەکـەیان گـوت ئـەریٚ ئـەو کـوڕەت کـویٚرە وا سـەیری ئـەو شـتانە ئـەکات و یەکسـەر ئـەڵیٚ ئـەها ئـەوە ،خۆ یەکـەم جـاری نیـە کـە بینیویەتی ،دایکەکەش لە وەڵام دا ئەڵیٚ بـەڵیٚ کوڕەکـەم لەتەمـەنی منداڵیـدا کـویٚر بـوو ،پـاش ماوەیـەکی زۆر لـە ئەزیـەت و زەحمـەتی توانیمـان نەشـتەرگەری بـۆ بکـەین و ڕونـاکی بـۆ چـاوی کوڕەکـەم بگەڕیٚتەوە ،وە ئـەمڕۆ یەکـەم ڕۆژی بینینـی کوڕەکەمـە بـە شـتەکان ئیٚستا ئەتوانیٚ جوانیەکان ببینیٚ لەبەر ئەوە ئەوەندە ئەڵیٚ ئەها دایـە سـەیری ئـەوە بکە،کـە دوو گەنجەکـە ئەمـەیان بیسـت بەڕادەیـەك شەرمەزار بوون کە بەوەسف کردن نایەت ،ئەمە بەهۆی چیەوە بـوو ئاوایان لیٚ بەسەر هات!؟پیٚش ئەوەی لە ڕاستی و خەستی مەسەلەکە تیٚبگەن یەکسەر بەچاوی سەر بڕیاریان دا،بەڵام ئەگەر تیٚی بفکرینایە و بەعەقڵ سەیری بابەتەکەیان بکردایە ئەوا توشی ئـەو شـەرمەزاریە نەدەبوون .ئاگادار بوون لەو شتانەی کە پیٚت دەگات زۆر زۆر گرینگە ،چونکە هەموو شتیٚك ئاسان نەگاتە دەستت بەڵام بەئاسـانی بـاوەڕی پـیٚ مەکە،هـەر هـیچ نـەبیٚت تـۆ لـە ڕۆژگاریٚـك دایـت کـە هـەواڵی

نادروست زۆر بەخێرایی بڵاو ئەبێتەوە ،تا بێت لە وە بێ ئاگابی کە باوەڕ بەچی ئەکەی ،لەبەرئەوەی هەواڵی نادروست کەسێکی بێ مەعریفەت دروستی ئەکات وە کەسێکی گێل بڵاوی ئەکاتەوە وە کەسێکی بێ عەقڵ باوەڕی پێ ئەکات ،وە لەهەمان کاتیشدا پێویستە بەهۆی ئەوەی کەدەی بینی و دەیبیستی کۆیبکەیتەوە و ئینجا بە عەقڵ بڕیاری لەسەر بدەی ، چونکە هیچ کامێکیان ناتوانن بڕیاری دروست بدەن بەتەنیا بەبێ ئەوانی تر هەروەکو لەوتەیەکی پڕشنگدار دا هاتووە ئەڵێ(ئەگەر شتێکت بە چاوەکانت ئەبینی و بە گوێچکەکانت نەت بیس ئەوا بەمێشکە بچوکەکەت بڕیار مەدە و بەدەمە گەورەکەشت باسی مەکە)(د.زاکیر نایک)،واتا تەنانەت عەقڵیش بەتەنیا نابێت بۆ بڕیاردان بەبێ ئەوانی تر، ئینجا بێ داربوونەوە لەو بابەتە وەکو دۆزینەوەی شتێکی گران بەهایە بۆ تەمەن،چەندە بیربکەیتەوە لەوەی کە بەواقیع شادبی ئەوا زیاتر ئەتوانی ڕاستگۆیی بکەیت بەدیوارێك کە خۆت و بگرە کەسی تریش ئەپارێزی لە تەوەفانی درۆ و بابەتە ناڕاستەکان.

**لەکۆتایی دا پەردەلەسەر چەند ئامۆژگاریەك هەڵ دەدەینەوەو دەڵێین:**

پێش ئەوەی هەر کارێك ئەنجام بدەی کە ئامانجی کارەکەت لەژێر سێبەری ڕاستی دا بینی پێویستە پێش ئەوەی بەیانی بکەی بۆ کەسێکی تر بەیانی بکەیتەوە ناخی خۆت و لەسەر خۆتی جێ بەجێ بکە پاشان بۆ کەسەکانی تری باس بکە،

بەوکارەت کێشەی نەبونی ئیرادەت نابێت لەکاتی باسکرنی یاخود جێ بەجێ کردنی دا، چونکە یەکێك لە سەیر و سەمەرەکانی ڕاستی ئەوەیە (هەرچەندە لەوتنی بترسیت سەر بەرزت ئەکات وە درۆ و شتی ناڕاست چەند لێی دڵنیا بی بێ ڕێزت ئەکات )،

هەوڵ بە لەژیانت دا ڕاست گۆیی تاجی سەرت بێت ، وشەی زارت بێت،پۆشاکی بەرت بێت ،شوێنی حەوانەوەت بێت، وە لەهەر شوێنێك بووی بابەتی ڕاستی وەربگرە،ڕاستی دەربڕە،ڕاستی ببەخشە

وە ڕاستی بکە بە پردێك کە هەمیشە بەسەریا ڕێ بکەی،

لە هەرکوێیەك ئامادەبووی ئەو ڕاستیانەی کە لە ناخت دا بوونی هەیە مەیگۆڕە لەبەر خاتری کەسێکی تر تا لێت ڕازی بێت،کەسێك بە ڕاستیەکی تاڵ قبوڵت نەکا بابەدرۆیەکی شیرین تۆی هەر نەوێ ، هەروەکو لەوتەیەکی زێڕین دا هاتووە دەڵێ(وەکو ئاوبە ڕەنگی ڕاستی خۆت مەشێوێنە ،چونکە ئاو خەسڵەتی خۆی لەدەست نادات چ لەناو کوپی قوڕیکرێت یان زێڕ یان هەرشتێکی تر بەڵکو خۆی لەگەڵ هەموو شکڵەکان دەگونجێنێ بێ ئەوەی تام و ڕەنگ و بۆنی سروشتی خۆی لەدەست بدات )،

خودای گەورە ڕاستی بکات بە بەهاری دڵەکانمان و خۆری ڕوخسارەکانمان و شیرینی سەر زمانمان تا بتوانین بەهۆی ڕاستگۆییەکەمانەوە شتێك لەسەر دەمەکەمان بگۆڕین ئەگەرچی کەمێکیش بێت نەوەکو ناڕاستیەکمان بینی بڵێین ئەوە پەیوەندی بە ئێمەوە نیە باوازی لێ بهێنین خەڵکی چۆنن با وابن ،

بەڵکو هەرتاکێك بەخۆی بڵێ(من ناتوانم جیهان بگۆڕم، بەڵام ئەتوانم بەردێك فڕێدەمە ناو ڕوبارێك و چەند شەپۆلێك دروست بکەم).

بۆنەوەی هەست بە سەنگی ئەم چەند دێرە بکەی کە خوێنتەوە یەکسەر پرسیارێك لەخۆت بکەو بڵێ ئایا تاکەی بەو شێوەیە بەردەوام بم ئایا من بەئجم یاخود بەئاگام و تەنیا خۆم خافڵاندوە؟ تا بە شێوەیەکی باشتر لە ڕاسیەکان تێبگەم ،هەر لەبەر ئەوە با خۆم یەك لایی کەم لەگەڵ خۆم!!، بەڕاستگۆیی بگەم یا لەگەڵ ناڕاستیەکان دا جێگاکەم بە خۆم دادەم و چاولێك بنێم و کاتێك بەئاگابێمەوە کە کاتژمێرەکەشم توانایی ژماردنی کاتەکانی نەماوە و وەستاوە،بەهیوای بڕیارێکی چاك بۆ هەموو لایەك......!

ئەگەر قسەکانمان کەمێکی تر کورت بکەینەوە بۆ باسکردنی ئەم بابەتە گرینگەمان ئەوا ئەتوانین لەم چەند دێرەدا بڵێین:

کەڕاستی نەما درۆ هاتە جێــــی

هەرچی هەڵەیە زمان دێتە ڕێــــی

سەری زۆر فیتنە هەڵ ئــەداتەوە

کێشەش بە ئەستەم ئــەکوژێتەوە

بەڵام گەر هاتوو ڕاستــی مان ڕوان

زۆر بەدوور ئەبین لە فیتنەی زمان

(نوسەر).

ئەمە ناوەڕۆکی هەموو بابەتەکە بوو بەشێوەیەکی کورت ...*_*

**لەكۆتاییدا** سوپاس بۆ خودای باڵا دەست کە لەم نامیلکەیەشمدا بە ئێوەی ئازیز شادبوومەوە ئەگەر تەمەن میوان بێت لە بابەتی تریشدا پێتان ئەگەمەوە، وە پێویستە ئەوەش بزانین کە هیچ کەسێك فریشتەی بێ هەڵەو بەفری بێ پەڵە نیە لە کەموکوڕی و هەڵەکانمان ببورن تا بتوانین بەبەردەوام بووممان لەسەر ئەم کارە بەردەوامی لەسەر خوێندنەوە بە خوێنەر ببەخشین ، ئەبێت مرۆڤ ئەوەی لەیاد نەچێت کە ئەوەی دەیزانێ گەردێکەو ئەوەشی نای زانێت گەردوونێکە بۆیە باشترین ئەرك کەپێی هەڵیسین وەکو مرۆڤ ئەوەیە بەردەوام بین لە کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی شتەکانی دەوروبەرمان تا ئەگات بەوەی کێشەی تێگەیشتنمان نەبێت لێیان لەخوای گەورە داواکارین لەژێر ڕۆشنایی بەرنامەکەی خۆی زیاتر بەرێگاکانمان ئاشنا بکات ،

بەهیوای سودبینین.

## سەرچاوەکان:

١.قورئانی پیرۆز: بەشێك لەشیکردنەوەکان و هەندێك لە ئایەتەکان

٢.فەرموو دەکانی پێغەمبەرمان(صلی الله علیه وَسَلَمْ) .

٣.وتەی پیاو سالحان و بیرەمەندەکانی رۆژگار.

٤.چەند سەرچاوەیەکی تر کە تەنها سودم وەرگرتوە لەشێوازی نوسینەکەی.

٥.کتێبی نمونە بەرزەکان لە نوسینی (حسێن محمود هەڵەبجەیی).

٦.تێڕوانینی خۆم بۆ دیوی دووهەمی شتەکان و تێگەیشتنت لێیان وپاشان وسف کردنیان.

٧.لەگەڵ چەند کتێبێکی تری مەسعود لەعلی .

بەناردنی تێبینیەکانتان خۆشحاڵ دەبم و وەکو
دیاریەکی بەنرخ لێتان وەر ئەگرم

**بۆ گەیاندنی بە من ئەتوانن لەڕێگەی ئەمانەوە پەیوەندیم پێوە بکەن:**

Facebook//Renas Adnan

Email//renasadnan141@yahoo.com



ئامانجی سەرەکی نوسینی
ئـــەم نـــامیلکەیە تەنها
سودبینین و ئـــاشنابوونـی
خوێنـــەرە بە لایەنێك لــە
لایەنەکانـــی ڕاستـــی تا
بتوانێت لـــەسەر ڕێگەی
ڕاستـــی لا نەدات و لــە
تاریکـــی ژووری نەزانیدا
وێڵ وتەنیانەبێت...(*-*)